

ناوی کتێب : نازەی نازەوان و مشکەی ناشەوان
نوسینی : کۆکردنەوە و نوسینی قومری فەهیمی
نیگارەکان : مریم عبدالله
تایپ : کاروان حاجی یەحیا ٠٧٥٠٤٤٢٢٣١١
دەرهێنانی هونەری ناوەوەو بەرگ : خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣
تیراژ : ( ١٠٠٠ ) دانە

شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژ هەڵات- هەولێر ٠٧٥٠٤٦٣٩٥٣١
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن (٦٦٨) ساڵی ٢٠١٢ی دراوەتێ.



- پێش کەشی ئەکەم بە هاوسەرەکەم.
- پێش کەشی ئەکەم بە دەریا .
- پێش کەشی ئەکەم بە شارا.
- پێش کەشی ئەکەم بە جوانیتا.
- پێش کەشی ئەکەم بە سیامند.
- پێش کەشی ئەکەم بەهەموو منداڵە چاوگەشەکانی کوردستان.









# پێشەکی

زۆر لەمێژە ئەو چیرۆکانـــەی کە داپیرەم بۆی ئەوتم لەگوێمـــدا ئەزرنگایەوە حەزم ئەکرد چۆن لە خەیاڵی خۆمدا هـــەردەم بۆ خۆمی ئەڵێمـــەوە بۆ مناڵەکانمی ئەڵێمـــەوە هەتا بەشـــێوەی شـــانۆگەری بەیارمەتی منداڵەکانـــم و هاورێـــی منداڵەکانـــم لەقوتابخانەی منداڵەکان پێشکەشم کرد هەروەها پێم خۆشە لەدوای خۆم ئەم نامیلکە یان کورتە چیرۆکە فۆلکلۆرە لەیادی مناڵـــە چاوگەشـــەکانی کوردســـتان نەچێتەوەو هەر بمێنێ ئەوە بەزیندوی ســـودی لێ وەربگرن هیوادارم کتێبخانەی منداڵانی پێ دەوڵەمەند بێت.



هەبوو نەبوو کەس لەخــوای گەورەتر نەبوو لەماڵێکی زۆر قەدیمدا بە چکە سیسرکێ کە هەر لە منداڵیوە دایکی لەدەست دابوو لەگەڵ باوکی دا ئەژیا ئەم باوکە زۆر کچە سیسرکەکەی خۆش ئەویست و زۆر نازی ئەکێشــاو هەلەبەر ئەوە ناوی نابوو نازەی نازەوان ئەم باوکە هەم جێگای دایکی گرتبوەوە هەم باوکێکی زۆر دڵســۆزو میهرەبان بوو هەروەها (نازەی نازەوان) یش کچێکی نازدارو ئاقڵ و دەســت ڕەنگین و جواب بوو.

ئەم باوکە بەڕۆژدا هەرچی دەســت ئەکەوت لەگەڵ کچەکەی پێکەوە ئەیان خوارد وەکو چاوی نازەی نازەوانی ئەپاراست هەتا ڕۆژێک بەکچەکەی ووت

کچە جوانەکەم کچە ناســک و باڵا بەرزەکەم کچە دەســت و پەنجە بلورینەکەم ئەوا من قسەیەک ئەکەم واتێ نەگەی کەوا لەتۆ بێــزار بووم کچە جوانەکەم تۆ تەنها کەســێکی کەمن دڵخۆش ئەکەیت.

مــن هەرتۆم هەیە، بەڵام خۆت ئەزانــی کەوا من پیربووم و ناتوانم ئیتر خەرجی تۆ بکێشم.

وا باشــترە ئیتر تۆش تۆزە تۆزە بیــر لەخۆت بکەیتەوە و هاوسەری ژیانی خۆت بدۆزیتەوە!



نازەی نازەوان کە ئەمەی بیست سەری داخست و لەشەرمدا سورهەڵگەڕا و کەوتە بیر کردنەوە و لە دڵی خۆیدا ووتی چی ی؟!

من شووبکەم جا شووبکەم بەکێ؟

خۆ من جلێکی جوانم نیە، جیهازیم نی یە، کەسیشـــم لەشک نی یە خۆمن.... و چەند پرســـیارێکی تر لەم خەیاڵەدا بوو کە باوکی ووتی کچە جوانەکەم ئەگەر شـــووت کرد ئەبێ شـــوو بە پیاوێکی زۆر چاک بکەیت .

نازەی نازەوان ووتی ها! یەعنی ئەبێ چۆن بێ؟!

باوکەکە ووتی ئەبێ پیاوێکی زۆر میهرەبان بێت هەرگیز ئازارت نەدات خەرجیت بکێشێ، نازت بکێشێ، لەگوڵ کاڵترت پێ نەڵێ......

جگەرەش نەکێشێ ئەی چۆن کچە جوانە کەم ئەبێ وابێت.

نازە ووتی باشە بابە گیان بە چاوان.

نازەی نازەوان لەو کاتەوە ئەم قەسیەی لە باوکی بیست بوو کەوتبووە ناو فکرو خەیاڵێکی زۆر گەورەوە بەڵام چونکە کەل و پەلی پێویستی نەبوو تەنانەت دەستێ جلی ڕێک و پێکی نەبوو هەروەها کەسێکی وا باش کە باوکی ئەیـــووت ئەویش نەبوو هەتا ڕۆژێک نازەی نازەوان ناوماڵەکەی گسک ئەدا سەیری کرد لەسوچی پشت دەرگاکەوە هەندێ خاک و خۆڵ کەوتوەتە خوارەوە نازە ی نازەوان وویســـتی خۆڵەکە کۆبکاتـــەوە بەڵام بینی ئەنگوســـتیلەیەک کەوتووەتە ناو خۆڵەکەوە بەپەلە هەڵی گرتـــەوە بینی کە زۆر جوان و ڕەنگینە هەر لەم کاتەدا ئەکەوێتە خەیاڵی شوکردنەکەی و ئەڵی ها ئائا ئەمە ئەبەم بۆ بازاڕ،



بەشکم خوا دەرگای رحمەتم لێ بکاتەوە بزانم چەند ئەکات؟

تۆ بڵێ ی بتوانم هەندێ کەل و پەلی پێ بکڕم هەر زوو ئەیبات بۆ بازاڕ



و ئەچێ بۆ لای جەواهیر فرۆشێک و ئەڵێ فەرموو کاکە بزانە ئەم ئەنگوستیلەیە چەند ئەکات؟ جەواهیر فرۆشکە بەبینینی ئەنگوستیلەکە زۆر سەرسام ئەبێ و ئەڵێ ئەمە پارەیەکی زۆر ئەکات، نازەی نازەوان لەخۆشیدا دەمی ئەکاتەوە و ئەڵێ ها! دەباشە ئەی فرۆشم.



جەواهیر فرۆشەکە پارەیەکی زۆری ئەداتێ و نازە زۆر بەدڵ خۆشیەوە لە دوکانی جەواهیر فرۆشەکە دێتە دەرەوە و ئەچێ بۆ بازاڕ و ئاواتی دڵی ئەکات و کەل و پەلێکی زۆر ئەکرێ و هەمووی ئەباتەوە بۆ ماڵەوە هەر زۆر گورج و گۆڵ و هەمووی دەستەو



بەســـتە ئەکات و هەندێ پارەی لێ ئەمێنێتـــەوە و ئەیدات بەجووتێ کەوشـــی پاژنە بەرز و دەســـتێ جل و بەرگی جوان بە چارەکەیەکی بنەوشی زۆر جوان زۆر بەپەلە خواردنێک بۆ نیوەرۆ ئامادە دەکات و چاوەرێ ی باوکی ئەکات باوکی تۆزی درەنگ دێتەوە بۆ نانی نیوەرۆ نازە زۆر نیگەران ئەبێ و دەســـت ئەکات بەهات و چۆ بەناو ناڵەکەدا و ئەڵـــێ ئەی خوایە باوکم بۆ نەهاتـــەوە تەقەی دەرگاکە دێت ئەڵێ ئۆخەی ئەوا باوکم هاتەوە.

زۆر بە پەلە بەرەو پێش وازی باوکی ئەڕوان و ئەڵێ بابەگیان بۆچی درەنـــگ هاتیتەوە باوکی ئەڵێت ئەوە چی یە نازە گیان بۆ وا بەلەیت پرسیتە یان چی ڕویداوە.

نازەی نازەوان ئەڵێ چۆن چی ڕویداوە بابەگیان

ئەمرۆ ماڵەکەم کســـک ئەدا لە ســـوچێکی دەرگاکـــە کەمی هاتبووە خوارەوە منیش ووسیتم کۆی بکەمەوە بەڵام کەبینم ئەنگوستیلەیەکی زۆر جوان و گران بەهام دۆزیەوە منیش بردم بۆ بازار و فرۆشـــتم و کۆڵێ کەل و پەلم کڕیوە.

نازەی نـــازەوان ووتی بابەگیان تۆزی بەپەلە نانەکەت بخۆ ئیتر من ئەبێ برۆم!

باوکی زۆر بەسەرسامیەوە ووتی بۆ کوێ ئەرۆی نازەی نازەوان نازە ووتی بۆ بابەگیان ئەی ببرت چوو کەچیت ووت ئەچم بۆ شـــاری شو



کردن.

باوکـــی کەمێک خەم دای گرت و ووتی ئەزانـــم ئەگەر برۆی ئەوا من تەنها و دڵ تەنگ ئەبم بەڵام قەیناکات برۆ بیرت نەچێ پیاوێکی زۆر باش هەڵبژێری بۆ هاوسەری ژیانت.



نازەی نازەوان ووتی باشە بابەگیان بەچاوان نازە، جل و بەگە جوانەکانی لەبەرکرد و کەوشە پاژنە بەرزەکەی لەپێ کردو چارۆکە بنەوشەکەی لەشان کردو دەستی کردە ملی باوکی و خواحافیزی لێ کردو ووتی ماڵت ئاوا نازەی نازەوان کەوتە ڕێ بەکۆچەو کۆڵانەکانی شاردا کە گەیشتە ناو بازار گەیشت بەو قەسابە قەڵەوەی کە هەموو جارێک باوکی گۆشتی لێ ئەکڕێ قەسابەکە کە نازەی بەم شێوە جل و بەرگە جوانەوە بینی زۆر سەرسام بوو.





نازەوان، نازێ نازێ تەق تەقە کەوشێ چارۆکە بنەوشێ بۆ کوێ نازە بەنازێکەوە ووتی ئەچم بۆ شاری شوکردن
قەسابەکە ووتی: دەورە شوبکە بەمن !
نازە ووتی باشە ئەگەر شو بکەم بۆتۆ بەچی بەخێوم ئەکەی؟
قەسابەکە زۆر بەتورەیەوە ووتی چۆن بەچی بەخێوت ئەکەم!
دووبارە قەسابەکە ووتی: بەو ئیسقانانەی کە ئەمێنیتەوە و ئیتر کەڵکی فرۆشتنی نامێنێ! هەمووی ئەدەم بەتۆ کەوا باشترین خواردنم بۆ دروست بکەیت و باشترین خزمەتم بکەیت نازە ووتی چی ؟ ئێسقان!
قەسابەکە ووتی : ئەی خۆ هەموو نەرمە کۆشتەکە نادەم بەتۆ و ئێسقانەکە بفرۆشم ئەی چۆن کاسبی ئەکەم ئەبێ تۆزێ دەست پێوە بگرم بۆ ئەوەی ببم بە ماڵ نازە ووتی باشە قەیناکە ئەی ئەگەر هاتو شەڕمان بوو تۆ بەچی ی لێم ئەدەی؟
قەسابەکە زۆر بەتورەیەوە ووتی: چی ی ؟ ئەگەر بێت و شەڕمان بوو ئەوا ئا بەم گۆشت کۆتە ئەکێشم بەسەرتاو ناهێڵم بژی لەڕووی زەویدا.
نازەی نازەوان کە لەترسا ڕەنگی زەردبوو ووتی: لاچۆ لاچۆ من شووناکەم بەتۆ، تۆ ئەڵێ ی شێت و هاری نازانی چۆن ڕێ و ڕەسمی هاوسەرداری.
نازەی نازەوان زۆر بەدڵ شکاوی بەردەوام بوو لەڕۆیشتن تاکو گەیشتە



دوکانی میوە فرۆشـــەکەی کە هەمـــوو جار باوکی میـــوەی لێ ئەکڕی بەدەنگی میوە فرۆشـــەکە بەئاگا هات کە ووتی نـــازێ نازێ تەق تەق کەوشێ بۆ کوێ دەروشێ؟

نازەی نازەوان بە نازێکە وە ووتی ئەچم بۆ شاری شوکردن میوە فرۆشەکە ووتی دەوەرە شـــو بکە بەمن ئەی شۆخ و شەنگ نازە ووتی باشە ئەگەر شوو بکەم بەتۆ بەچی بەخێوم ئەکەی؟

میوە فرۆشەکە ووتی چۆن بەچی بەخێوەت ئەکەم!

میوە فرۆشـــەکە ووتی خەمت نەبێ بێ خواردنـــت ناکەم هەرچی میوەو سەوزەی ڕزیو خراپ هەیە هەمووی ئەهێنمەوە بۆ ماڵەوە بۆتۆ!

جـــا بزانم چۆن کەی بانویەکی چۆن ئاومیوەم بۆ دروســـت ئەکەی یان چۆن زەخێرەی زســـتان ئەخەی و میوەو سەوزەم چۆن بۆ ووشک ئەکەی یان چۆن زەڵاتەیەکم بۆ دروست ئەکەی؟

نازەی نازەوان بەســـەر ســـامیەکەوە ووتی چی؟ بەسەوزەو میوەی ڕزیو بەخێوم ئەکەی؟

میوە فرۆشـــەکە بە توڕەیـــەوە ووتی ئەی چی ئەتەوی میوەو ســـەوزە جوانەکە هەمووی بهێنمەوە بۆتۆ خراپەکەی بەخەڵک بفرۆشم؟ جا چۆن کاسبی وا ئەبێ؟

نـــازەی نازەوان ووتی: قەیناکە چش لێ گەڕێ لە خواردن و خۆراکم ئەی ئەگەر شەڕمان بوو بەچی لێم ئەدەی؟

میوە فرۆشـــەکە زۆر بەتوڕەیەوە ووتی ئەگەر شەرمان بوو ئەزانی

بەچی لێت ئەدەم ؟ نازە بەترسەوە ووتی بەچی؟
میوە فرۆشەکە ووتی ئابەم سنوقە میوانە ئەکێشم بەسەر ملت داو سەروچاوت ئەشکێنم، نازە زۆر بەترسەوە ووتی : نا نا شوناکەم بەتۆ زۆر ڕەزیلی تۆ زۆر توڕەی نا شوناکەم بەتۆ
نازە زۆر بەدڵ شکاویەوە بەردەوام لە ڕۆیشتن تاگەیشتە بەردەم دوکانی دانەوێلە فرۆشەکە کوا باوکی دانەوێلەی لێ ئەکڕی .
دانەوێلە فرۆشەکە کە چاوی بەنازە کەوت زۆر بەبێ ئەدەبی یەوە ووتی : ئەوە نازە ڕەنگ زەردی قاچ و قول باریک ئەچی بۆ کوێ؟
نازە ووتی ئەوە چی یە بۆ ئەوەندە بێ ئەدەب و نزاکەتی؟
چۆن ئەبێ ئاوا بەم شێوەیە لەگەڵ خانمێکی وەک مندا قسە بکەیت
دانەوێڵە فرۆشەکە شەرمی لەخۆی کرد کەوا بەم جۆرە قسەی لەگەڵ خانمێکی هەست ناسکدا کردووە.
دانەوێڵە فرۆشەکە ووتی: بم بوورە خانمە جوانەکە من چونکی خوێندەواریم نی یە و شیعر نازانم لەبەر ئەوە زۆر جوان نازانم قسە بکەم ئەگەر دڵت نەیەشاوە دەپێم بڵێ بزانم بۆ کوێ ئەڕۆی؟
نازەی نازەوان زۆر بەناڕەحەتیەوە ووتی ئەچم بۆ شاری شوکردن
دانەوێڵە فرۆشەکە ووتی باشە وەرە دەی شووبکە بەمن .
نازەی نازەوان ووتی ئەگەر شوبکەم بەتۆ بەچی بەخێوم دەکەی .
دانەوێلە فرۆشەکە ووتی:قەینا لەبەر خاتری تۆ دەست ئەنێم بەماڵی خۆمەوە هەرچی نۆک ، نیسک و جۆ ، گەنم هەیە کە بژارم


کردووە و خراپەکەیم لێ جیاکردوەتەوە ئەوا خراپەکەی بۆ تۆ جا بزانم چۆن شۆربایەکم بۆ دروست ئەکەی.

نازەی نـــازەوان زۆر بەنیگەرانیەوە ووتی جا چۆن بەو خەوش و خۆڵە شۆربات بۆ دروست بکەم، باشـــە بەهەر حاڵ ئەی ئەگەر شەرمان بوو بەچی لێم ئەدەی؟

دانەوێلە فرۆشـــەکە ووتی: ئەگەر شـــەڕمان بوو ئەم تەرازوە ئەکێشـــم بەسەرتاو ئابەم کۆچانە قاچ و قۆلە باریکەکەت ئەشکێنم.

نازەی نازەوان زۆر بەدڵ تەنگیەوە ووتی نا نا شو بەتۆ ناکەم

دانەوێڵە فرۆشـــەکە ووتی: دەی زوو برۆ تاقاچم نەشکاندوی دەی ..... دەی

ناز ووتی ئەگەر نمونەیی هاوســـەر لە ئێوە بێت ئەوا قەت شوو ناکەم با دەورێکی ئەم بازاڕ بگەڕێم ئەچمەوە لای باوکم و هەرگیز شوناکەم.

بـــەڵام لەم کاتەدا بوو کەنازە بۆ خۆی ئەگەڕا لە پڕ چاوی بە مشـــکەی ئاشـــەوان کەوت هەر ئەو مشـــکەی کەوا لای ئاشـــکەیماڵی خۆیانەوە هەمیشە لەم تاگەنم بۆ ئەوتا ئارد ئەچوو و هەمیشە ئارداوی و هیلاک خەریکی بەدەست هێنانی نان بوو بۆخۆی زۆر هەوڵی ئەدا.

مشکە ئاشـــەوان ئەویش زۆر بەسەرسامیەوە نازەی بینی و ووتی ئەوە تۆی نازەگیان، نازەی نازەوان، نازە چاوجوان، نازەتەق تەقەکەوشێ چارۆگە بنەوشێ ئەوە لەکوێ ی ئەچی بۆ کوێ؟

نازێ بەنازیکەوە ووتی: ئەرێ وەاللە منم ئەی مشـــکەی ئاشـــەوان ئەی



مشکە گیان چاورەش، سمێل قەیتان

ئەی تۆ ئەچی بۆ کوێ مشکە گیان مشکەی ئاشەوان ووتی: نازێ نازەوان بیســـتومە ئەچی بۆ شاری شوکردن هاتومەتە ســـەر ڕێگات بەڵکو ببی بەهاوسەری من نازە بەنازیکەوە ووتی نموونەی هاوسەرم زۆر دی پاش گەز بوومەوە شوناکەم تۆبە بێ ئەچم لەگەڵ باوکم ژیان ئەکەم.

مشکە ووتی ناگوڵەکەم تکات لێ ئەکەم ئەبم بەنموونەی هاوسەری چاک تکات لێ ئەکەم نازە بەنازێکەوە ووتی باشـــە ئەکەر شوت پێ بکەم ببم بە هاوسەرت بەچی بەخێوم ئەکەی .

مشکەی ئاشەوان ووتی: نازە گیان هەرچ ماڵە دەوڵەمەندێک هەر چیەک بخۆن ئەوا سەرگۆڵەکەی ئەهێنم بۆتۆ

نازە ووتی : باشە ئەی ئەگەر شەڕمان بوو بەچی لێم ئەدەی؟

مشـــکەی ئاشەوان ووتی: ناگوڵەکەم لێدان چی یە ؟ لێدان هی پیاوی نا حاڵیە، من بەقسەی خۆش حاڵیت ئەکەم.

هەرچـــی خەمە لەدڵتی دەرئەکەم جـــار جارێکیش ئەگەر غەم باربوویت ئەوا بەکلکم ئەتخەمە پیکەنین.

نازە ووتی باشە مشکە گیان ئەی لەکوێ بخەوم

مشکە ووتی: لەسەر خیکە ڕۆن

نازە ووتی: وی نا چەور ئەبم

مشکە ووتی: لەسەر شانە هەنگوین

نازە ووتی: ناشیلاوی ئەبم



مشکە ووتی: لەسەر کوپە پەنیر

نازە ووتی: نادوای ئەکەومە خوارێ دوای شەل ئەبم

مشـــکە ووتی : باشە نازەگیان لەســـەر ئەم توگە گەرم و نەرمەی خۆم بخەوە نازە بەنازێکەوە ووتی باشە ئەمەیانم بەدڵ بوو

مشکە ووتی دەی نازەگیان زوو جوابم بەرەوە دڵم بە بەریەوە نەماوە

نازە ووتی: ئەگەر وای مشکە گیان بچۆ بۆ لای خزمەتی باوکم زوو....

مشـــکە ووتی ئەی بەچاوان هەر زوو بەبێ دواخستن خۆی و خاوخێزانی چوونە خزمەت خەزووورە گیانی

باوکی نازە کە بەمەی زانی نازەگیان هەڵی بژاردووە هاوســـەری گیانی بەگیانی زۆر خۆشحاڵ بوو.

باوکی نازە ووتی : پێش کەشە مشکە موبارەکە

مشکەلەخۆشـــیدا دەســـتی باوکی نازەی نازەوانی ماچ کرد وتەدارەکی زەماوەندی گێرا و ئاهەنگێکی گەورەی بەرپاکرد هەموو خزم و دراوســـێ کانی بانگ کرد حەوت شەو حەوت ڕۆژ زەماوەندی گێرا، نۆقڵ و نەباتی بەخشـــیەوە، بەڵام لەوکاتەدا کە خەریکی نـــان خواردن بوو کەوچکێک شلە ڕژا بە جلەکانیدا بەمە مشکە زویر بوو

نازە ووتی: مشکە گیان خەفەت مەخۆ ، بەیانی خۆم بۆت ئەشۆم ئەوشەوە بەخێرو خۆشی کۆتایی هات و لەبەختی مشکەی ئاشەوان ڕۆژهەڵات.

نازێ نازەوان هەرزوو جل و بەرگی مشـــکەی خستە تەشتێکەوە و بردی بۆ ســـەرچەمی سیروان ویســـتی بشـــوات بەڵام بەداخەوە نازێ قاچی



هەڵخلیســکاو کەوتە ناو چەمەکەوە بەڵام باش بو کەدارچنارێک لەوێدا بــوو نازەتوند خۆی بە چڵەی لەڕیشــەی دارەکە خــۆی گرتەوە بەڵام نــەی توانی بێتە دەرەوە لە ئاوەکە نازە هــاواری ئەکرد فریام کەون، فریام کەون لەبەختی نازە پیاوێکی سوارچاک کە بەخۆی ئەسپەکەیەوە هاتبوو بۆ ڕاوەماسی ووتی ئەوە ئەوە ئەو هاوار هاوارە کێ یە ؟

نازەی نازەوان ووتی: ئەوە منم نازەی نازەوان ژنی مشــکەی ئاشەوان کەوتەومەتە چەمی سیروان.

تکایە ئەی سوارە خەبەر ببە بۆ هاوسەرم با زۆر بەپەلە بێت بۆ نەجاتی ژنە جوان و نازدارەکەی بێ ی بڵێ کەوتووەتە چەمی سیروان هەر شەش پەلکەکەی شەماڵ ئەی شەکان.

ســوارە ووتی : باشە مشکە ئاشــەوان لەکوێ یە نازەی نازەوان ووتی: چوزانم لەماڵی پاشایە.

سوارە ووتی: باشە لەماڵی پاشا چی ئەکا؟

نازەی نازەوان ووتی: خەریکە ســەر گوڵی زەخیرەکانم بۆ کۆئەکاتەوە

سوارە ووتی باشە شێوەو ڕوخساری چۆنە؟

نازە ووتی: باڵای خروخەپانە، چاوی ڕەشە، سمێڵی قەیتانە

سوارە ووتی: ئەگەر وابێ ئەوا زۆر قۆزو جوانە

نازە ووتی: سوارە تکات لێ ئەکەم زوو برۆ زوو بەڵام ئەگەر ڕۆیشتی پێ ی بڵێ با زنجیری زێڕینم بۆ بێنی جا دەرم بهێنی.

هەروەها پێی بڵێ با پۆپەشــمینەم بۆ بێنێ نەوەک لەسەرما لەرزم لێ بێ ســوارە زۆر بەپەلە چوو بۆ ماڵی پاشا و هاواری کرد هۆ مشکە هۆ



مشکەی ئاشـــەوان زوو وەرە ! نازەی نازەوان کەوتوەتە چەمی سیروان
هەر شەش پەل کەکەی شەمال ئەی شەکان مشکەی ئاشەوان ئەمەی بیست
زۆر سەری سوڕماو خەفەتی خوارد مشکە ویستی ڕاکات و هاوسەرەکەی
لەناو ئاو دەرکات بەڵام ســـوارە ووتی پەلەنەکات چونکە ئەبێ زمجیری



زێرینی بۆ ببات و پۆشمینە ئەگینا نازە دڵی ئەڕەنجێ.

مشكەی ئاشەوان ووتی ئەی خوایە كەی وەختی ئەمەیە بەڵام ناچاربوو كە بیبات ئەگینا نازێ دڵی ئەڕەنجێ.

بەڵێ مشكەی ئاشەوان بەخۆی و زنجیری زێرینەوەو پۆشمینەوە گەیشتە سەر چەمی سیروان .

مشكە ووتی: نازێ نازەوان نازێ گیان لەكوێ ی بەقوربان .

نازێ ووتی : ئەوا هاتی هاوسەرە وەفادارەكەم ئەوەتام

مشكە ووتی باشە دەستم بەرێ با دەرت بێنم

نازە ووتی، نــــا ، ،نــــا پەلم ئەبجر ێنێ،

مشكە ووتی باشـــە پەلكە كانتم بەرێ بادەرت بێنم

نازە ووتـــی :،نـــا، نـــا، قژم دەردێنی

مشكە زۆر بەنیگەرانیەوە ووتی :

نازە گیان ئەی چۆن دەرت بێنم

نازە بەنازێكەوە ووتی: ئەی نەم ووت زنجیـــری زێرینـــم بۆ بێنە ئینجا دەرم بێنە

مشكە ووتی: ڕاست ئەكەیت نازە گیان هێناومە بەڵام لەتاوا بیرم





نەبوو.

مشـــکە زوو زنجیـــرە زێڕینەکـــە دەرئەهێنێ و سەرێکی دابە دەستی نازەوە ووتی بیگرە بەقوربان.

نازە بەنازێکەوە ووتی باشە مشکە گیان

مشـــکە نازەی نازەوانی دەرهێناو خستیە ناو پۆشمینەکەوەو خستیە سەرشانی و هێنایەوە بۆ ماڵەوە و زوو جـــل و بەرگـــە تەڕەکـــەی لەبەر دەرهێنـــاو بەرگی تری بۆ لەبەر کرد بەڵام بینی نازە لەرزی لێ هاتووە.

مشکە ڕای کرد بە شوێن حەکیمدا و هێنـــای بۆ لای نازەی نازەوان حەکیم کە نازەی بینی ووتی ترســـاوە لەناو ئاوی سارد لەرزاوە ئەبێ شۆربای بۆ لێ بنێ ی تاچاک ببێتەوە.

مشکە ووتی باشە بەسەرچاو هەر ئێستا بۆی دروست ئەکەم

مشـــکە زوو باوەشـــێ داری هێناو ئاگری کردەوەو مەجەڵێکی گەورەی سەرخست و نۆک و نیسک و گۆشت و شەلەمی تێ کرد مەنجەڵەکە هاتە کوڵ مشکە ویستی تێ کی بدات بەڵام بەداخەوە مشکە باڵای ئە ئەگەیشت



بە مەنجەڵەکە چوو دوو ، سێ بەردی خستە سەر یەک و کەوچکی گرت بە دەستەوە کە مەنجەڵەکە تێک بدات بەڵام زۆر بەداخەوە بەردەکان لەژێر قاچی خزاو مشکە بەسەرەوە کەوتە ناو مەنجەڵە شۆرباکەوە نازە دوای کات ژمێری یەک دووجار هاواری کرد ووتی: مشکە، مشکە، مشکە گیان، مشکەی ئاشەوان بەڵام جواب نەبوو دووبارە نازە ووتی و هاواری کرد ئەی هاوسەرە وەفادارەکەم خۆ تۆ ئەزانی من نەخۆشم ناتوانم هاوار بکەم بۆ جوابم نادەیتەوە بەڵام ئەم جارەش جواب نەبوو. نازەی نازەوان ناچار بوو بەلەرزە لەرز بێت بزانێت بۆچی مشکە جوابی نی یە ؟ بەڵام کە هات چی بینی بینی مەنجەڵێ شۆربا وا ئەکولێ و مشکەی ئاشەوان وا بەسەر شۆرباکەوە قوڵپ ئەدا نازەکە ئەمەی بینی و قیژاندی ووتی ئەی هاوار هاوسەرە وەفادارەکەم و لەهۆشی خۆی چووە لەقیژەکەی نازە دراوسێ کان هاتن و مشکەیان دەرهێنا و بەخاکیان سپارد بەڵام نازە لەو رۆژەوە ڕەشی پۆشی و چاو بەگریان ئەگری بۆ مشکەی ئاشەوان بۆ مشکە گیان.



